# پەرستار



ژمارە 12
ئایار-ی 2014

گۆڤارێکی تەندروستی و رۆشنبیری گشتییە، کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان دەری دەکات

## رۆژی جیهانی پەرستاران
## لە هەموو پەرستارانی کوردستان پیرۆز بێت




5/12

# پەیامی کۆمەڵە

**پەرستارانی خۆشەویست ..**

بە ناوی کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان پیرۆزبایی ڕۆژی جیهانی پەرستاران لە سەرجەم پەرستارانی جیهان و کوردستان بەتایبەتی دەکەین.

پەرستاران هەروەک و لاتان ئاشکرایە (5/12) هەموو ساڵێک ڕۆژی جیهانی پەرستارانە وە ڕۆژی دامەزراندنی کۆمەڵەکەتانە، بەم بۆنەیەوە هەنگاوی زیاتر دەنێین بۆ بەرەو پێش بردنی ڕەوشی پەرستاری لە هەرێمی کوردستان وە دابینکردنی سەرجەم مافەکانتان. هەروەها هەنگاو دەنێین بۆ باشترکردنی ڕەوشی سیستەمی تەندروستی لە هەرێمی کوردستان، پەرستاران ئێوە کە چرای ڕووناککەرەوەی ئێستا و داهاتوون پێویستە زیاتر بایەخ بە پیشەکەتان بدەن لە ڕێگەی جێبەجێکردنی ئەرکەکانتان بۆ ئەوەی بتوانین ئەم ڕەوشەی ئێستای پەرستاری باشتر بکەین.

لەم یادە پیرۆزەدا وەک کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان هەوڵەکانمان چڕتر دەکەینەوە بۆ ئەوەی بتوانین لە ڕێگەی لایەنی پەیوەندیدار بگەین بە ئامانجی هەموو پەرستارانی کوردستان کە دروستبوونی سەندیکای پەرستارانە.

لە کارنامەی کۆمەڵە دایە تەواوی هەوڵەکانی بەکاربهێنێت بۆ پەیرەوکردنی یاساکان و جێ بەجێ کردنی بڕیارەکان کە ئەمەش دەبێتە هۆی گێڕانەوەی بەشێک لە ئەرک و مافەکانتان.

لەم ڕۆژەدا کە ڕۆژی لەدایکبوونی خاتوو ( فلۆرانس نایتنگل ) ە پێویستە وەکو بەڕێزیان نموونەی چرای ڕووناکی بین.

**بۆ ئەمانەش ئەنجوومەنی جیهانی پەرستاران**

( International Council of Nurses ICN:) بابەتێکیان هەڵبژاردووە کە کاری لەسەر دەکەین لەژێر ناونیشانی:

Nurses: A force for change

**A vital resource for health**

**وە**

**پەرستاران: هێزێک بۆ گۆڕانکاری سەرچاوەی زیندگی بۆ تەندروستی**

بۆیە پێویستە ئێوەش ئەوەی لەسەر شانتانە جێ بەجێی بکەن. ببنە ئەو هێزەی کە گۆرانکاری لە سیستەمی تەندروستی ئەنجام بدەن بەمەبەستی باشترکردنی ڕەوشی سیستەمی تەندروستی لە هەرێمی کوردستان.

کۆمەڵەکەتان لە هەوڵی ئەوە دایە کە ببێتە ئەندام لە ئەنجوومەنی جیهانی پەرستاران بە فەرمی. بۆ ئەم مەبەستەش لە لۆگۆی ئەمساڵ بابەتەکەیان ووشەی (پەرستاران)یان داناوە شان بەشانی وڵاتانی دیکە.

لە کۆتاییدا وێڕای دەستخۆشی و ڕێزمان بۆ ئێوەی خۆشەویست، دووبارە پیرۆزبایی لە سەرجەم پەرستاران دەکەین.

**کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان**

**دەستەی باڵا**

2014/5/ 12

# پەرستار

گۆڤارێکی تەندروستی و ڕۆشنبیری گشتییە، کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان دەری دەکات
ژمارە (١٢)ی ئایار-ی ٢٠١٤







خاوەن ئیمتیاز
**کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان**

سەرنووسەر
**هیوا ئەحمەد محەمەد**
Mobil: 0750 4775337
hiwacath@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین
**ڕەیان جوهەر حوسێن**
Mobil: 0750 4736575
yara_emc@yahoo.com

دەستەی نووسەران
* سەرهەنگ قادر ئیبراهیم
* گۆران ئەبوبەکر عوسمان
* هندرێن یونس ئەجم
* شاڵاو فارس ئەحمەد
* نورەدین حەمەدەمین عەلی
* بورهان عەلی حەمە حوسێن
* د. عەبدولقادر حوسێن ئەحمەد

نەخشەسازی
**کاوە فاروق عەلی**

ناونیشان:
هەرێمی کوردستان- هەولێر - دوو سایدی نەورۆز- تەنیشت فەرمانگەی ئای تیی

Eemail: ksnurses@yahoo.com

# دیدارێک لەگەڵ بەڕێز سەرۆکی کۆمەڵە

**پیرۆزبایی لە بەڕێزتان دەکەین بەبۆنەی دەست بەکاربوونتان وەک سەرۆکی کۆمەڵە و هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازین ..**



**• دەکرێ لە چەند دێڕێک خۆتان بناسێنن؟**

من سەرهەنگ قادر أبراهیم لە شاری هەولێر لەدایک بوومە و سەرجەم قۆناغەکانی خوێندنم لەم شارە تەواو کردووە، لە ساڵی (2001) بڕوانامەی دبلۆمم بەدەستهێناوە لە پەیمانگەی تەکنیکی هەولێر- بەشە پزیشکیەکان، لە ساڵی (2008) بڕوانامەی بەکالۆریۆسم بەدەستهێناوە لە زانستی پەرستاری لە زانکۆی هەولێری پزیشکی.

لە ساڵی (2012) بڕوانامەی ماستەرم بەدەستهێناوە لە تەندروستی گشتی لە کۆلێژی پزیشکی – زانکۆی ئۆفیغن لە وڵاتی فەرەنسا.

ئێستاش مامۆستام لە کۆلێژی پەرستاری لە زانکۆی هەولێری پزیشکی و سەرۆکی کۆمەڵەی زانستی پەرستارانم.

**• خوێندنەوەی بەڕێزتان چی یە لەسەر سیستەمی تەندروستی بەگشتی و کاری پەرستاری بەتایبەتی لەهەرێمی کوردستان؟**

وەک ڕوونە لای بەڕێزتان سیستەمی تەندروستی لە هەرێمی کوردستان سیستەمێکی زۆر لەمێژینەیە، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە پێداچوونەوە بە سەرجەم یاساکانی تەندروستی بکرێت. بەهۆی کارکردنم بۆ ماوەی (14) ساڵ لەم بوارەدا تێبینی زۆر خاڵی لاوازمان کردووە لەم سیستەمەدا کە دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە هاولاتیان بە پلەی یەکەم و ئابووری کوردستان بە پلەی دووەم و پلەی سێیەمیش کاردەکاتە سەر ئاسایشی تەندروستی لەهەرێمی کوردستان. چونکە نەبوونی سیستەمێکی تازە دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە هەر تاکێک لە کۆمەڵگا و بڵاوبوونەوەی جۆرەها نەخۆشی و کارەسات، لە ڕووی پەرستاریشەوە ئەوەی کە ڕوونە نەبوونی پێناسەی کار (Job Description)ە بۆ پەرستاران و تێکەڵبوونی پیشەکەیان لەگەڵ لایەنی دیکە لە بواری تەندروستیدا وەک پزیشک و کارمەند و هتد.....

بۆیە زۆربەی کات پەرستاران ناتوانن کارەکانیان بەشێوەیەکی سیستماتیک پێشکەش بکەن لە دام و دەزگا تەندروستیەکاندا. سەرەڕای هەموو ئەمانە ئێمە بە گەشبینیەوە لە ئایندە دەڕوانین بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتانەی باسمان کرد.

**• ڕوانینتان بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتانەی باستان کرد چی یە؟**

وەک باسمکرد هەندێ کێشە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی سیستەمی تازە لە کەرتی تەندروستی، چونکە لە زۆربەی وڵاتاندا ساڵانە پلانی تازە دیاری دەکەن بۆ دەوڵەمەندکردنی سیستەمی تەندروستی. بەڵام تاوەکو ئێستا ئەم پلانە نابینرێ لە لایەنی پەیوەندیدارەوە. ئێمە کارنامەیەکی تازەمان هەیە بۆ چارەسەرکردنی بەشێک لە گرفتەکان، بۆ نمونە بە یاساکردنی ئەرک و مافی پزیشک و پەرستار و کارمەند و لایەنەکانی دیکە و جێبەجێ کردنیان لە دام و دەزگاکاندا چارەسەرە بۆ ئەم کێشانە و



سود بەخشیشە بۆ هاولاتیان، چونکە لەماوەی رابردوودا بە کردنەوەی چەندەها نەخۆشخانەی تازە و سەردەمیانە گرفتی هاولاتیان و نەخۆش بەتایبەتی چارەسەرنەکراوە. هیوادارین بتوانین کار لەسەر پلان و بەرنامە بکەین نەک دروستکردنی بالاخانەی مودیرن بۆ نەخۆشخانەکان.

**• وەک کۆمەڵە بەرنامەتان چی یە بۆ باشترکردنی رەوشی پەرستاری؟**

لە راستیدا ئەم پرسیارە لە جێگەی خۆیەتی، بۆ زانیاریتان نزیکەی مانگێکە دەست بەکاربوومە وەک سەرۆکی کۆمەڵە، دوای گەرانەوەم لە دەرەوەی ولات بە گوڕ و تینێکی زۆرەوە هاتینە ناو ئەم کۆمەڵەوە، بۆ هەمان مەبەست کە بەرەو پێشبردنی رەوشی پەرستارانە لە هەرێمی کوردستان.

بەلام ئەوەی جێگای تێبینیە ئەو یاسایانەی کە کۆمەڵەکان کاری پێوەدەکەن وەک یاسای ولاتانی دیکە نیە. بۆ نمونە کۆمەڵەی پەرستارانی ئەمریکی دەسەلاتێکی رەهایان هەیە لە کەرتی تەندروستی لە هەمان کاتیشدا بەرپرسن لە کێشە و گرفتەکان و دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان و جێ بەجێکردنیان.

بەلام لە کۆمەڵەدا ئێمە ناتوانین هەموو شتێک ئەنجام بدەین، سەرەرای ئەوەی ئێمە گرفتەکان دەستنیشان دەکەین و چارەسەریان بۆ دەدۆزینەوە بەلام لایەنێکی تر دەبێت بە خاوەنی جێ بەجێکردنەکە ئەمەش خۆی لەخۆیدا هەم کێشەکە چارەسەر ناکات هەم رەوشی پەرستاریش بەرەو پێشەوە ناچێت و گەشە ناکات.

بۆ نمونە تاوەکو ئێستا وەصفی وەزیفی لە کوردستان جێ بەجێ ناکرێت کە رۆلی سەرەکی هەیە لە دیاریکردنی ئەرک و مافی پەرستاران و بەرە و پێش بردنی تواناکانیان.

**• گرنگی بوونی سەندیکای پەرستاران بە چارەسەر دەزانی؟**

بێگومان بەڵێ، چونکە وەکو باسمکرد ئەو یاسایانەی کە سەندیکا و کۆمەڵەکان رێکدەخا لە هەرێمی کوردستان دەسەلاتێکی فراوانتر دەدات بە سەندیکاکان نەک کۆمەڵەکان، بۆیە بوونی سەندیکای پەرستاران بە پێویست دەزانین، چارەسەری زۆربەی کێشەکانی پەرستاران دەکات و هۆکارێکە بۆ بەرەوپێشبردنی کەرتی تەندروستی. چونکە پەرستاران زیاتر لە 50% ی کەرتی تەندروستی پێک دەهێنن. بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵەکانمان بەردەوامە بۆ بە سەندیکاکردنی کۆمەڵە. ئێستاش چاوەروانی پەرلەمانی کوردستانین کە ئومێدمان وایە چەند یاسایەک دەربچێت بۆ باشتر کردنی کەرتی تەندروستی و بەرەوپێشبردنی رەوشی پەرستاران وە بوونی یاسایەک کە هاوشێوەی ولاتانی دەرەوە بێت بۆ دروستبوونی سەندیکای پەرستارانی کوردستان.

**• لە کۆتاییدا دەتەوێ ئاماژە بە چی بکەیت ؟**

وێرای پیرۆزبایمان لە سەرجەم پەرستارانی کوردستان بە بۆنەی (5/12) هیوادارین بتوانین لە ئاست ئەو بەرپرسیاریەتیەدا بین کە لەسەر شانمانە، لێرەوە دەستخۆشی لە یەکە دیکەی ئەندامانی دەستەی بالای کۆمەڵەکەمان دەکەم کە بەبێ دریغی و بێ هیچ ئیمتیازێک کاردەکەن بۆ بەرەوپێشبردنی پیشەی پەرستاری و کاری کۆمەڵە.سوپاسی هەموو پەرستارێکی خۆشەویست دەکەم کە هاوکارمانن لە زۆربەی کاتەکاندا.

**لە کۆتاییدا زۆر سوپاس بۆ سەرۆکی کۆمەڵە بەرێز (سەرهەنگ قادر أبراهیم) بۆ رەخساندنی ئەم دەرفەتە.**

# سوودەکانی گوێزی هندی بۆ تەندروستی مرۆڤ



د. کەریم فەتاح عەزیز بەرزنجی

گویزی هندی بەزمانی ئینگلیزی پی ی دەلێن (coconut) وەرگیراوە لە( کۆکۆ) بەزمانی برتغالی واتە مەیمون چونکە گویزی هندی لەسەری مەیمون دەکات .

ئەم بەرهەمە لە وولاتی هندستان زورەو لە وولاتی عەرەبیش لەسەلتەنەی عومان هەیە چونکە هەواکەی شێدارەو دەکەوێتە سەر دەریای عەرەب وە لە ئێران هەیەو پێی دەلێن بارنج وە لە تورکیا پێی دەلێن نارجیل هەروەها لە ئەندونسیاو موزەنبیق و مەکسیک زۆرە وە لە شوێنی گەرم وشێدار دەرۆیت و هەر دارە نزیکەی 35 گویز دەدات .

پێکهاتەی کیمایی گوێزی هندی بریتیە لەرۆنی زەیتی و ترشی اسید بەریژەی 45-50 % و ترشی پالمیلیک 10 % وە بێجگە لە ترشەکانی ستاریک و لنویک و کادوک وە هەروەها کانزاکانی فۆسفۆرو کالسیوم .

لەگرینگترین سوودەکانی بۆ تەندروستی مرۆڤ بریتین لەچالاککردنی سووری خوین و پاریزگاری کردن لەتووش بوون بەجەلتەی دەماغ و دل وەقژ بەهێز دەکات و یارمەتی گورچیلەو جگەر دەدات بۆ ئاسان کاری لەکارەکانیان و کەم کردنەوەی چەوری زیانبەخش و زیادکردنی چەوری سوود بەخش و سوودی هەیە بۆ نەخۆشی شەکرەو یارمەتی هەرس دەدات و ئەمە جگە لەوەی کە لەناو گویزی هندی ئاویک هەیە کە زۆر سوودی بۆ تەندروستی هەیەو ناسراوەبەئاوی ژیان وەپیک هاتووەلە90% ئاوو بەشەکەی تری پیک هاتووەلەکانزاکانی وەکو پوتاسیوم و مغنیسیوم و صودیوم و فتیامنات وە سوودی هەیە بۆ بەهێزکردنی ووزەی لەش بۆ وەرزشکردن و دابەزینی کیشی لەش و راگرتنی پالەپەستۆی خوێن و بەهێزکردنی دل و بوریەکانی خوین و وە سوودی هەیە بۆ تەرکردنی پێست و رزگارکردنی لەش لە هەندیک لە پاشماوەکان لە ریگەی کوونەکانی پێستەوە وە یارمەتی کرداری هەرسکردن دەکات بەتایبەتی لە بەساڵاچووەکاندا وە لە دوایین توێژینەوەدا دەرکەووتووە کە خواردنەوەی ئەم شلەیە بۆ ماوەیەکی زور یارمەتی توانەوەو هاتنەخوارەوەی بەردی گورچیلە دەدات وە لەبەر ئەوەی مادەی کاربۆهیدراتی کەمەو الیافی زورە سوودی بۆ نەخۆشی شەکرەهەیەوەدەرکەوتوەکەهارینی پەلکی گویزەکەو تحمیز کردنی یارمەتی دەرەبۆ سپی کردنەوەی دانەکان و پاراستنی پووکی ناو دەم و نەهیشتنی بۆنی ناخۆشی ناو دەم وە زانای ئەمەریکی (ئازنوونی) لە زانکۆی تکساس پاش لیکۆلینەوە بۆی دەرکەوتوە کە ئەوانەی رۆژانە1-2 گۆیز دەخۆن ئاستی چەوری سوود بەخش (HDL) و بەرز دەکاتەوە بەرادەیەک کە لەش سوودی لی دەبینی و پاریزگاری لی دەکات لەتووش بوون بەنەخۆشیەکانی دڵ و لولەکانی خوێن هەروەها کەمکردنەوەی چەوری زیان بەخش (LDL). بەهیوای تەندروستیەکی باش .

سەرچاوە:
1 - قاموس التداوي بالنبات
2 - الموسوعة الحرة
3 - انتەرنیت



# حەوت سەرسورهێنەرەکەی جەستەی مرۆڤ



**نورەدین حەمەدەمین عەلی**
دەستەی بالا

1 -تاکەبەش لەلەشی مرۆڤ کەخوێنی بۆناچێت رەشێنەی چاوە
2 -مرۆڤ لەباری ئاساییدا لە یەک خولەکدا (16)جار هەناسە دەدات



3 -گوێی چەپ بە هێزترە لەگوێی راست لە بستندا
4 - هەرمرۆڤێک سالانە بری یەک تەن ئاو دەخواتەوە
5 - مێشکی مرۆڤ لە(14) هەزار ملیۆن ووردیلە خانە پێک دێت
6 - ژمارەی خرۆکە سوورەکانی خوێن لەلەشی مرۆڤدا (25)بلیۆن خرۆکەیە
7 -درێژی شادەمارەکان(600) هەزار کیلۆمەترە

# 28 سوودی سیر

1 -دژی ڤایرۆسی تاعون (قولەچاوە)یە
2 -خوێن پاک دەکاتەوە
3 -پەستانی خوێن دادەبەزێنی
4 - دل چالاک و بەهێز دەکات
5 -کرمی ریخۆلەو گەدە دەکوژێت
6 -ئارەزووی (سێکس)زیاد دەکات
7 -بەسوودە بۆ تەنگە نەفەسی و هەناسە توندی کەم دەکاتەوە
8 -کرمی ئەکسیورپ و کرمی ئەسکارس دەکوژێت
9 -دەبێتە هۆی نەمانی کریشی سەر
10 -دژی هەوکردنی ریخۆلەیە
11 -گەرمی هێنەرە بۆلەش
12 -هەرس لە گەدەدا ئاسان دەکات
13 -ناو دەم پاراو دەکات و زوو توونێت نابێت
14 -میزهێنەرە بە سوودە بۆ دابەزینی لم و بەردی گورچیلە
15 -دژە ژەهری پێوەدانی ژەهراویەکانە
16 -پووک و ددان بە هێز دەکات
17 -وریاکەرەوەیە
18 -بۆ لاوازی بە سوودە
19 -چالاکی بە دل دەدات و لیدانی دل ریک دەخات
20 -مێشک بە هێز دەکات
21 -دەمارە کرژەکان خاو دەکاتەوە
22 -دژی مێکرۆبی شیرپەنجەیە
23 -چاو رۆشن دەکات وبینایی بە هێز دەکات
24 -بۆنی ناخۆشی ناو دەم ناهێلێت
25 -بەسوودە بۆ باداری رۆماتیزمە
26 -دەبێتە هۆی چاک بوونەوەی ژانە سەر
27 -گەشە بە کورپەلەی ناو سک دەدات
28 -شەکرەی خوێن رادەگری



# نەخۆشیەکانی مێشک

د.عبدالقادر حسین احمد



ئەمانە دوو جۆرن

1. نەخۆشیە ئەندامیەکانی مێشک ( organic disease)

بریتین لەو نەخۆشیانەی مێشک کە هۆیەکی ئەندامی وەکو (برینداری شانەی مێشک) ی هەیە.

2. نەخۆشیە فەرمانیەکانی مێشک ( functional disease)

ئەو نەخۆشیانەن، کەهۆیەکی ئەندامی یان تێدا نادۆزرێتەوە. لێرەدا ئێمە تەنها باسی نەخۆشیە فرمانی یەکان ئەکەین کە دوو پۆلن:

أ. هۆشتێکچون خەمۆکی و شادی (Manic Depressive Psychosis)

دڵتەنگی مرۆڤ تا ئاستی خۆکوشتن، دەمێکی تر مرۆڤ چالاک و دڵخۆش و رووکراوەیە. لە هەر بارێکدا چەند هەفتەیەک یان چەند مانگێک دەمێنێتەوە.

ب. شیزۆفرینیا (أنفصام الشخصیە) – Schizophrenia

باوترین نەخۆشیەکانی مێشکە و زۆربەی نەخۆشیەکانی نووستوی ناو نەخۆشخانەکان دەگرێتەوە. بە پێچەوانەی باوەری خەڵکی یەوە، شیزۆفرینیا فرەکەسایەتی نی یە و دووکەرت بوونی کەسایەتی نی یە. لێرەدا هەندێ کەس لەگەڵ جۆری لەهیستریا تێکەڵ دەکەن. شیزۆفرینیا بەپێی نیشانەکانی دەکرێ بەچوار چەشنەوە:

1. ئەوانەی هەست بەشێوانی هەست و سۆزیان ناکرێ، تەنیا بێتاقەت و سست و نەخۆش دیارن.

2. ئەوانەی گرنگی بەدەورو بەریان نادەن و هیچ چێژ لە دەوروبەرو تێکەلاوی خەلکی وەرناگرن. گرنگی بە رووداوەکانی ناوخۆیان دەدەن.

3. ئەوانەی توشی هورێنە (Hallucination) و بوون و شتەخەیالبازی (Delusion) یەکان بەراست دەزانن.

4. ئەوانەی بیرکردنەویان دەشێوێ و قسە دەبزرکێنن و ووردە ووردە زیرەکی و یادیشیان دەشێوێ و بەرەو شێواوتر دەچن.

بەلام زانستی نوێ و پزشک و دەروونزانەکان، شیزۆفرینیایان بە دوو جور پۆلین کردووە.

1. ئەوانەی لەزۆر زووەوە توشیان هاتووە و لەوەوپێش هەلس و کەوتی کومەلایەتی یان لەهەرزەکاری یان لەسەرەتای پێگەیشتنیانەوە شێواوە. بەدەگمەن بەتەواوی چاکدەبنەوەو پێیان دەووترێ شیزۆفرینیای پرۆسیسی ( Schizophrenic Process)

2. ئەوانەی لەناکاو تووش دەبن و لەوەوپێش هەلس و کەوتی کومەلایەتییان ئاسایی بووەو لەکارەساتێکی ناهەموار تووشیان بووە، ئەوان شانسی چابوونەوەیان زۆرترە بۆ بارێکی ئاسایی.

هۆیەکانی تووش بوو بە شیزۆفرینیا:

1. رەچەلەکی
2. شوێنەواری
3. کیمیاوی یە

ئەگەر بڵێین هۆکارەکەی بەتەواوەتی رەچەلەکە، کەواتە ئەوەی نارێکی لەکرۆمۆسۆمەکانی هەبێت دەبێت شیزۆفرینیای هەبێت شوێنەوارەکەی هەرچۆنێک بێت. وەئەگەر شوێنەوار بەهۆکار دابنێین، ئەوە رەچەلەک رۆلی نابێت لەتووشبونی ئەم نەخۆشیەدا. بەلام لە راستی دا دەرکەوتووە ئەوانەی کەم و کوری کرۆمۆسۆمیان هەیەو لە ژینگەیەکی نالەباریشدا دەژین ئەوە ئەگەری توشبونیان بە شیزۆفرینیا زیاتر دەبێت.

ئەگەر باوانێک شیزۆفرینیای هەبێ [50 %]ی منداڵەکانیشیان توشی دەبن. ئەگەر [100] منداڵ کەدووانە بەیەکیوە بووبن، شیزۆفرینیایان هەبێ لە [46] یان دا، تاکە دووانەکەی تریش شیزۆفرینیایان هەیە.

| Population | incidence (%) |
|---|---|
| General population | 1.0 |
| Sibling of schizophrenic patient | 8.0 |
| Child with one schizophrenic parent | 12.0 |
| Dizygotic twin of a schizophrenic pt. | 12.0 |
| Child of two a schizophrenic parents | 40.0 |
| Monozygotic twin of a schizophrenic patient. | 47.0 |

(لەینگ – R.D. Laing) ی پزیشکی دەروونی ئینگلیزی دەڵێ:

شیزۆفرینیا لەئەنجامی رووداوە ناهەموارو پەیوەندی یە نالەبارەکانی ناو خێزانەوە دروست دەبێ.

بیردۆزی کیمیاویش وادادەنێ کە ئەم نەخۆشیە لەئەنجامی زۆربوونی جۆرە ماددەیەکی کیمیاوی یەوەدروست دەبێ کەخۆی لەدەماغ دا دەبێ.

دەرکەوتووە خواردنی دەرمانی {LSD- 25 } و {میسکالین} نیشانەکانی





شیزۆفرینیا لەمرۆڤی ساغ دا دروست دەکەن.

هەندێ ماددەش لەلەشی مرۆڤ دا هەیە گرینترینیان _ سیرۆتونین_ {Serotonin}ە. لەپێکهاتندا زۆر لە {LSD} میسکالین دەچن.

شیزۆفرینیا پەیوەندی بەزۆر بوونی ئەم مادانەوە هەیە لە دەماغ دا. زۆر جار بۆ چارەسەرکردنی شیزۆفرینیا جورە دەرمانێک بەکاردەهێنرێ کەزۆربوونی لە ئاسایی بەدەری ئەم مادانە ناهێڵێ.

بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی ژیری دوو ڕێگای هەیە:

1. ڕێگای سروشتی: لەم ڕێگایەدا دەرمان یان ڕێگەی فسیولۆجی یان سەر لەکارەبادان یان نەشتەرگەری دەماغ بەکار دەهێنرێ.

2. چارەسازی دەروونی: لەکۆمەڵە ڕێگایەک پێکهاتوون ئەیەوێ هەڵس و کەوتی نەخۆشەکە بگۆڕێ. وەکو {شێکردنەوەی دەروونی، چارەسازی هەڵس و کەوت، چارەسازی بەکۆمەڵ}.

بەکارهێنانی هەر ڕێگایەکیش لەسەر ئەوەی بەندە کەچارەسازەکە هوی نەخۆشیەکە بەچی دەزانێ؟ ئەوانەی هوکارەکەی بەگۆڕانێکی فسیولوجی یان کیمیاوی دادەنێ ئەوە ڕێگای سروشتی بەکار دەهێنن. بەلام ئەوانەی کە شوێنەوار بەهۆکاری نەخۆشیەکەدەزانێ ئەوە ڕێگای چارەسازی دەروونی بەکار دەهێنن:

1. ڕێگەی سروشتی:

أ. سەر لەکارەبادان. ECT: یەکێکە لەو ڕێگایانەی هەر لەبیست سال لەمەو بەرەوە بەکارهێنراوە. لەم کارەدا

تەزوویەکی کارەبا بەدەماغ دا دەبردرێ. ئەمەش دەبێتە هۆی گەشکە- convulsion. لەهۆش خۆچوون {loss of consciousness} . ئەم ریگایە زیاتر لەچارەسەرکردنی دلتەنگی یە توندەکان و خەمۆکیەکانبەکار دەهێنرێ و سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ. لەزۆربەی کاتدا بەکار هێنانی تەزووی کارەبا زیانی کەمترە لە بەکارهێنانی دەرمان.

ب. دەرمان: زۆر دەرمان بۆ دەست بەسەراگرتنی نیشانەی نەخۆشیەکان بەکار دەهێنرێ. بەتایبەتی دەرمانەکانی دژە سایکۆسس و هەندێ جار دەرمانەکانی دژە دلەڕاوکێ و جێگیرکردنی مەزاگیش بەکاردەهێنرێ.

Mental Disorder

2. چارەسەری دەروونی:

لەسەر شێوەی دانیشتن دایە لەگەل نەخۆشەکان دا. بنچینەکەی لەکارەکانی فروید وەرگیراوە. سەرکەوتنێکی زۆر لە چارەسەرە دەروونیەکان بەدەست دەهێنێ. چاک بوونەوە یاخود هەلس و کەوت گۆڕین Change of Behavior زووتر دێت بەدەستەوە. ئەگەر نەخۆشەکە مل ملانێ و ویستەکانی ئەودیو هەستی ئاگادارکرایەوە. بۆ ئەم مەبەستەش یارمەتی نەخۆشەکە دەدرێ بکەوێتە دۆخی {یادکردنەوەی ئازاد- التداعي الحر – Association Free }. ڕێگەی دەدرێ چی بەخەیالدا داهات بیلێو قسەکەی پێ نابڕدرێ. ئەمەش شتێکی ئاسان نی یە بەتایبەتی بەیادهاتنەوەی { ململانێکان و ڕووداو و حەزوو ویستە کپ کراوەکانی منالی} کەبەچاوگی Source دەردەکەدا دەنرێ.

بە پێچەوانەی ئەمەشەوە چارەسازی هەلسوکەوت ناسی هاتەکایەوە کەبناغەکەی لە بیردۆزی فێربونی {پافلوف وسکینەر} وەرگیراوە. ئەوانەی هێنانەژێرباری سکینەر بەکار دەهێنن، ئەیانەوێ بەهۆی ئەم ڕێگایەوە دەست بەسەر نیشانەی نەخۆشیەکەدا بگرن و هەلس و کەوتی نەخۆشەکە بەشێوەیەکی پەسەند بگونجێنن. ئەوانەی هێنانە ژێرباری پافلۆفی بەکاردەهێنن. ئەم نیشانانە بەهەلس و کەوتی چاک نەگوجێنراو دادەنێن. وەکو میکانیزمێکی بەرگری لەدوو دلی یەکەی دەپارێزن.



# هەوکردنی ناوگەڵی منداڵ



و: هەردی عبدالقادر شێروانی
پەرستاری نیشتەجێی خولاو

هەوکردنی ناوگەلی مندال یان سوتانەوەی ناوگەلی مندال یەکیکە لە نەخوشییە زور بلاوەکانی پیست لە منداڵی ساوا . یەکیک لە هوکارەکانی هەوکردنی توندی پیست بەشیوەیەکی راستەوخو یان ناراستەوخو پەیوەندی هەیە بە لەپیکردنی بیجامە و دایبی(حەفازە) مندال . هەوکردنی ناوگەلی مندال روودەدات لە نیوان (9 بو 12) مانگی تەمەن وە ئەمەش لەو مندالانەی شیری وشک دەخون زیاترە لە چاو ئەو مندالانەی شیری سروشتی دایکیان دەخون .

**هۆیەکان**

• رووشان بەهوی ترشی میز و پیسایی
• سابونی بونخوش
• بیجامەی تەسک و خوری و در (زبر)
• تەری و گەرمی ناو دایبی وە ئەم تەری و گەرمییە دەمینیتەوە چونکە ناوپوشی دایبی نایلونە
• بەکتریا
• سپیەکەروو ( candida )
• سکچون
• دەرمانی دژە زیندە (Antibiotic)

**نیشانەکان**

• سووربوونەوە و پەلەی زیپکەیی لە ناو گەلی مندال
• بیزارکەر و مایەی ئازارە بو مندال چونکە دەبیتە هوی ئازاریکی زور بو مندالەکە.

**چارەسەرکردن**

1. پاککردنەوەی شوینی تووش بوو بە ئاو وسابون
2. هیشتنەوەی شوینی تووش بوو بەکراوەیی هەتا وشک دەبیتەوە
3. لیدانی هەتوانی (مەرهەم) زینک ئوکسید بو ساریژکردنی پیست
4. لیدانی هەتوانی دژە زیندە ئەگەر بەهوی بەکتریاوە تووشی هەوکردن بوو
5. لیدانی هەتوانی دژە کەروو ئەگەر هەوکردنەکە بەهوی سپیەکەروو بوو
6. لیدانی هەتوان یان کریمی هایدروکورتیزون لە ژیر رینمایی پزیشک.

**رۆڵی پەرستار لە چارەسەرکردن**

• پیستی مندال







بــەردەوام وشـک و پـاک بێت بە تایبەت ناوگەڵی
• یەکسەر گۆڕینی بێجامە یان دایبی دوای پیسایی کـردن یان میزکردن
• شوشتنی ناوگەڵی منداڵ بە ئاو و سابون بۆ زووتر چاکبوونەوە
• پێویستە هەموو هەتوانی پێشوو لاببردرێت ئینجا هەتوانی تری لێ بدرێت
• دەرمــان پـێدان بـە گـوێرەی ڕێنمایی پزیشک

## خۆپاراستن

خـۆپـاراسـتـن بـاشـتـرە لـە چـارەسـەرکـردن بـۆیـە پێویستە ئـەم خـاڵانـە جێ بـەجێ بکـەن تا منداڵەکانتان لە هەوکردنی ناوگەڵ بەدوور بێ :-

1. پـێـویـسـتـە دایـبـی ئـاو زۆر هـەڵمـژێت وە بـۆ یـەک جار بەکاربهێنرێت
2. زوو زوو دایبی منداڵەکەت بپشکنە و ئەگەر تەر بوو یان پیسایی کردبوو یەکسەر بیگۆڕە
3. شوشتنی ناوگەڵی منداڵ بە ئاو و سابون پاش پیسایی کردن
4. لێدانی هەتوان وەک هەتوانی (زینک ئۆکسید) بۆ پاراستنی پێست بـە تـایـبـەت ئەگەر ناوگەڵی منداڵ زۆر سووربویەوە
5. دوورکـەوتـنـەوە لـە شوشتنی نـاوگـەڵی مـنـداڵ بـە سـابـونی بـونـخـۆش چونکە لـەوانـەیـە نـاوگـەڵی سـووربـێـتـەوە لـەبـەرئـەوە ئـەو سابونەی لەلایەن پزیشک ڕێگەپێدراوە بەکاربیهێنە
6. پێش لە پێکردنی بێجامە یان دایبی پێویستە دڵنیابیت لە وشکی و خاوێنی ناوگەڵی منداڵەکەت
7. بێجامەی نایلۆنی تەسک کە بە پێستی منداڵ وەدەنوسیت نابێت لە پێی منداڵ بکرێت
8. دەست شوشتنی منداڵ پێویستە بـۆ ڕێـگـەگـرتـن لـە هـەمـوو جـۆرە هەوکردنێک



### سەرچاوەکان


1. Essentials of Pediatric Nursing, Sixth Edition
2. Straight A›S in Pediatric Nursing, Second Edition
3. ئینتەرنێت

# گۆشەی هەرجارەو شارەزاییەکی پەرستاری (کارامەییەکی پەرستاری)...



**لەلایەن: دارا عبدالله قادر**
ماستەر لە زانستی پەرستاری هەناو ونەشتەرگەری پێگەیشتووان
کۆلێژی پەرستاری زانکۆی هەولێری پزیشکی

سلاو بەڕێزان ....

خۆم بە خۆشحال دەزانم کە لەڕێگەی ئەم **گۆڤارە زانستی یەوە** بتوانم خزمەتێک **بە پەرستارانی بەڕێزو** نەخۆش و کاری پەرستاریدا بگەیەنم **ئەگەر بە چەند دێڕێکیش** بێت، ئەویش بە شی **کردنەوەی پڕۆسیجەری** ئەو شارەزایی و کارامانەی **کە مافی پەرستارە ئەنجامی بدات وەک** ئەرکێکی **پەرستاری لە نێوەندە** خزمەتگوزاریە تەندروستی یەکاندا.

**لێرەدا سێ مەبەستی سەرەکیم هەیە لە نووسینی ئەم شارەزایی و کارامانە:**

١. دووبارە وەبیرهێنانەوەی ئەو پروسیجەرانەی کە پەرستاران ئەنجامی دەدەن.

٢. نوی کردنەوە و ئاگادارکردنەوەی پرستاران لە زانیاری نوی دەربارەی پڕۆسیجەرەکان.

٣. یەکخستنی پڕۆسیجەرەکان لەسەر بنەمایەکی تەواو زانستی و دوور لە تەقلید و نەریتی هەلە.

لەگەل هەر پڕۆسیجەرێکیش هەولدەدەم هۆکارەکانی شی بکەمەوە کە ئاخۆ لەبەرچی ئەم هەنگاوانە بەم شێوەیە بکرێت باشترە.

شایانی باس کردنە لە سەرچاوەدا سوودم وەرگرتووە لە سایتەکی جیهانی بەناوبانگ تایبەت بە زانستی پزیشکی و تایبەتتر بە کارامەیی وشارەزایی کاری پەرستاری کە ناوی (Mosby) یە لەژێر لینکی www.elsevierperformancemanager.com/) (NursingSkills/Home

کە ئەویش سایتەکی بە بەرامبەرە واتا بە پارە ددتەوانیت بچیتە ناویەوەو سوودی لی وەربگریت. وەک ریکلامیک بۆ خۆی، کۆمپانیایەکە بۆ ماوەی دوو مانگ بەبی بەرامبەر ئەکاونتێکی بۆ مامۆستایانی کۆلێژی پەرستاری لە زانکۆی هەولیری پزیشکی دا کردەوە و منیش توانیم لەم ماوەیەدا زیاتر ٥٠٠ پروسیجەر داونلۆد بکەم بە نوێترین ئەپدەیتی سالی ٢٠١٣ کە لە نوێترین سەرچاوەکانەوە وەریانگرتبوو.

وەلەخوای گەورە داواکارم پشتیوانمان بێت بۆ بەردەوام بوون لە خزمەتکردنی نەخۆش و پەرستاران لە رێگای ئەم گۆڤارە پڕ لە زانستەوە.

شارەزایی وکارامەیی یەکەم: چۆنیەتی دانانی OPA بۆ نەخۆش

First Nursing Skill: Oral Airway Insertion

ئاگادابوون:

- OPA واتا Oropharyngeal airway یان پێی دەلێن ئیروەی کە بەکاردێت بۆ یارمەتیدانی ڕێک و پێکی هەناسەدان وکرانەوەی ڕێرەوی هەناسەی نەخۆش، لەکاتێکدا کە دەبێ نەخۆش لە باری بێ هۆشیدا بێت نەک هۆشداری، ئەویش لەوانەیە لە نەخۆشی هۆشدار ببێتە هۆی گرژبوونی بۆری هەناسە، ڕشانەوە، کۆخین، یان بەرچینچکە (gag reflex).

- بۆ دوورکەوتنەوە لە ڕشانەوەو هەلمژینی بۆ ناو بۆری هەناسەو سیەکان، دەبێ ئیروەی بەزووترین کات لابردرێت لەکاتی ڕوودانی بەرچینچکە.

پێداویستیەکان:

- دەست کێش.
- پارێزەری چاو.
- ماسک.

- ئامێری سەکەر (suction machine).
- پاڵەری زمان (tongue depressor).
- بیستەری پزیشکی (stethoscope).
- ئێروەی بە قەبارەی گونجاو.

هەڵسەنگاندن:

دەبێ دڵنیا بیت لەوەی کە نەخۆش لە باری بێ هۆشیدایە.

ئامادەکردن:

دەبێ نەخۆش لەسەر پشت پاڵکەوتبێت.

پرۆسیجەر:

١. شوشتنی دەست بە ڕێگایەکی زانستی و وشک کردنەوەی.

٢. لەبەرکردنی دەست کێش، ماسک، و پارێزەری چاو.

٣. ڕاکێشانی خوێن، دەردراو، شلە، وماددەی بێگانە لە ناو دەم و ناوەوەی قورگ بە ئامێری سەکشن.

٤. بە هۆی پاڵەری زمان، پاڵپەستۆ دەخرێتە سەر زمان بۆ خوارەوە و دواتر بۆ دەرەوە یان پێشەوە.

٥. ئێروەیەکە بە دروستی و ڕووەو خوار دەخرێتە ناو دەم و پاڵپێوە دەنرێت بۆ ناو قورگ تا لێواری دەرەوەی ئێروەیەکە دەلکێت بە ڕووی دەرەوەی لێوی نەخۆش.

٦. لە کاتێکدا ئەگەر پاڵەری زمان دەست نەکەوت وەیان نەتوانرا دەمی نەخۆش وەک پێویست بکرێتەوە بە هوی قفل بوونی شەویلاکی خوارەوەی، ئەوا دەبێ بە گۆشەی ٩٠ پلە ئێروەیەکە لەسەر لایەک بخرێتە لاتەنیشتێکی ناو دەمی نەخۆش و دواتر سوڕاندنی ئێر وەیەکە ڕووەو خوارەوەی قورگی و جێگیر کردنی تا ئەو کاتەی لێواری دەرەوەی ئێروەیەکە دەلکێت بە ڕووی دەرەوەی لێوی نەخۆش.

٧. دەبێ ئاگاداری شوێنی تایبەت بە ئێروەیەکە بیت و دڵنیا بیت لە جێگیری، چونکە ئەگەرلە شوێنی خۆی نەبێت ئەوا لەوانەیە پاڵەپەستۆ بخاتە سەر دیوی دواوە قورگ و ببێتە هۆی گیران و داخستنی قورگ.

٨. ئەگەر پێویستی کرد ئەوا هەواگۆرکێ (ventilation) بۆ نەخۆش دەکرێت.

٩. دانانی بیستەری پزیشکی (stethoscope) لەسەر سنگی نەخۆش و دڵنیا بوون لە ڕێکو پێکی و تەواوی هەناسەدان و ئاگاداربوون لەهەر دەنگێکی نا ئاسایی لەکاتی هەناسەدان.

١٠. ئەو پێداویستیانەی کە بەکارهاتوون دەبێ فڕێ بدرێنە شوێنی تایبەت وە ئەو ئامێرانەشی کە بەکارهاتوون دووبارە پاک بکرێنەوەو بگەڕێندرێنەوە شوێنی خویان.

١١. دووبارە شوشتنەوەی دەست دوای تەواوبوونی پرۆسیجەرەکە.

١٢. تۆمار کردن لە پەڕاوی تایبەت بە تێبینیەکانی پەرستار، کە دەبێ ئەم زانیاریانەی خوارەوەی تێدابێت:

- هۆکارو کاتی دانانی ئێروەیەکە و قەبارەی بەکارهاتوو.
- ڕێژە، ڕێک و پێکی، و قولی هەناسەدان.
- هەر دەنگێکی نائاسایی بیستراو لە کاتی هەناسەدان.
- ڕێژەی ئۆکسجین و دوان ئۆکسیدی کاربۆن لە خوێن دا.
- هەر گۆانکاری یەک لە ئاستی هۆشیاری نەخۆش و بەرچینچکە.

سەرچاوە:

Adapted from Perry. A.G.. Potter. P.A.. Ostendorf. W.R. (2014). Clinical nursing skills & techniques (8th ed.). St. Louis: Mosby.



# ئەرک و مافی نەخۆش


هیوا ئەحمەد

هەموو ئەوکەسانەی پێویستیان بە خزمەت گوزاری تەندورستی دەبێت ماف و بەرپرسیارەتیش دەیان گرێتەوە

مافی نەخۆش بەگشتی لەدۆسیەی حکومەتدا باسی لێ وە دەکرێت، (پەیماننامەی نەخۆش). پەیماننامەی نەخۆش جیاوازە لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکیتر، ئەویش بەپێی جیاوازی سیستەمی سەرپەرشتی یاچاودێری تەندورستی، یا کەلتوری و پیشەنگی.

ئامانج لە پەیماننامەی نەخۆش گەرەنتی پاراستنی بەرزترین ئاستی تەندورستی مرۆڤە هەروەها دابین کردنی باشترین جۆری خزمەت گوزاری تەندورستیەتی.

مافی نەخۆش بەندە لەسەر مافی مرۆڤ و بیرۆکەی مافی هەرکەسێک سەبارەت بە شکۆداری و یەکسانی یەکەی وەدەبێت رێزی لێ بگیرێت لەلایەن هەموو ئەوستافانەی کەپێش کەشکاری خزمەت و سەرپەرشتیاری تەندورستین.

لەهەندێک پەیمننامەدا هاتووە جگە لەدابین کردنی مافی نەخۆش، نەخوشیش هەندێ بەرپرسیارەتی بەرامبەر بەو خزمەت گوزاریە لەسەرشانە بۆزیاتر یارمەتیدان و کاراکردنی کارەکان.

بەپێی پەیمانی سکۆتلەندی 2012 ماف و بەرپرسیارەتی نەخۆش بەم شێوەی خوارەوە دیاری کراوە:

1. چوونەناو یادەستپێگەیشتن
2. پێ راگەیاندن و بەشداری کردن
3. بروا پێکردن
4. رێزگرتن
5. ئاسوودەیی
6. سەرنجەکان و گلەیەکان

نموونە بۆ ماف و بەرپرسیارەتیەکانی نەخۆش: پێ راگەیاندن و بەشداری کردن

- مافی نەخۆشە بەشداری لە هەموو بریارو چارەسەرێکدا بکات.
- مافی نەخۆشە زانیاری هەبێت سەبارەت بە هەڵبژاردنی جۆری چاودێری و چارەسەرکردنی.
- مافی نەخۆشە داوای یارمەتی بکات کاتی بریاردانی لە چۆنیەتی چاودێری کردنی باری تەندورستیەکەی.
- مافی نەخۆشە بۆ رێک پێ راگەیاندنی سەبارەت بە چاودێری و چارەسەرکردنی.
- مافی نەخۆشە بۆ پەسەندکردن یا رەتکردنەوەی هەر چارەسەرێک، تاقیکردنەوەیەک، یاپشکنینێک کەنیازبێ بۆی ئەنجامبدرێت.
- بۆ ئەوکەسانەی گەورەن و ناتوانن بریاری خۆیان بدەن سەبارەت بە چارەسەرکردن و چاودێری کردنیان بەبێ یارمەتی، دەتوانن چاوەڕوانی بەشداریکردن بن.
- ئەگەر کەسێک لە ژێر شانزەساڵیدا بوو، خاوەن پیشەتەندورستیەکانیش بەدوای بڕوای ئەو بوون ئەوە دەتوانن بۆخۆیان بریاردەن سەبارەت بە چاودێری و چارەسەرکردنیان.
- نەخۆش مافدارە بەشدار بێت راستەوخۆ یا لەرێگای نوێنەرەکانیان، بۆ پلان دانان و دارشتن و باسکردنی چۆنیەتی خزمەتکردنی لەو شوێنە.
- نەخۆش دەتوانێ هەندێک بەرپرسیارێتی سەبارەت بەتەندورستی خۆی هەڵبگرێت.
- نەخۆش دەتوانێ چالاکانە بەشداری مشتومڕو بریاردان بکات سەبارەت بە چاودێری و چارەسەرکردنی.
- نەخۆش دەتوانێ ئەگەر شتێک تێنەگەیشت پرسیار بکات.
- نەخۆش رێگا بەستاف بدات بزانێ لەهەر گۆڕانکاریەکی تەندورستی دا.
- نەخۆش بە ستاف بلێت لەکاتی هەرگۆڕانکاریەکی ناونیشان و تەلەفونەکەیدا.
- وەلەکاتی بەخشینی هەر ئەندامێکی لەش دوای مردن پێویستە ناوی نەخۆش لەسەر ئۆرگانەکە تۆماربکرێت.

# ئەو پشکنینانەی پێویستە هەموو پیاوێک ئەنجامیان بدات



شمس الدين عبدالله محمد
پەرستاری زانکۆ

دەستنیشانکردنی پێشوەختی هەندێک نەخۆشیی، دەکرێ ڕێگا لەو ئالۆزکارییانە بگرێت کە بەهۆی کۆنترۆڵنەبوونی حاڵەتەکەوە ڕوودەدەن، بەڵام بیرمان نەچێت پشکنین پزیشک دەینووسێت و لەسەر بنەمای تەمەن و هۆکاری تایبەتی ئەو کەسە دیاریدەکرێت.

1. شێرپەنجەی پرۆستات:

دووەم شێرپەنجەی بڵاوە لە پیاوان و شەشەم هۆکاری مردنە لەناویاندا. بە ئەنجامدانی پشکنین دەتوانرێت بەر لە دەرکەوتنی، نیشانەکانی نەخۆشییەکە دەستنیشان بکرێت.

پشکنین بە دوو ڕێگا ئەنجامدەدرێت، بەشێوازی سەریری لەلایەن پزیشک و بە پشکنینی PSA لەڕێگەی خوێنەوە ئەنجامدەدرێت.

پێویستە ئەو کەسانەی لە کەسانی نزیکیاندا کەسی تووشبوو هەیە، لە تەمەنی 45 ساڵیدا لەگەڵ پزیشک ئەم بابەتە تاووتوێ بکەن. ئەوانەشی کەسە نزیکەکانیان ئەم نەخۆشییەیان نییە، لە تەمەنی 50 ساڵیدا ڕاوێژی پزیشکی ئەنجام بدەن.

2. شێرپەنجەی گون:

شێرپەنجەیەکی ناباوە و لەنێوان تەمەنی 20-54 ساڵیدا ڕوودەدات.

زۆرێک لە پزیشکان ئامۆژگاری کوڕان و پیاوان دەکەن ماوە ماوە چێکی خۆیان بکەن، هەرکاتێک هەستیان بە لوو، گرێ، یان گۆڕانی قەبارەی گونەکانیان کرد سەردانی پزیشک بکەن بۆ دڵنیابوونەوە لە هەبوون یان نەبوونی شێرپەنجەی گون.

3. شێرپەنجەی کۆڵۆن و ڕێکە:

دووەمین هۆکاری مردنە بەهۆی شێرپەنجەوە و لە پیاواندا بڵاوترە لەچاو ژنان. سەرەتای ئەم شێرپەنجەیە لە لوویەکی ناشێرپەنجەییەوە دەستپێدەکات.

پشکنین بە نازوری کۆڵۆن، یان تەکنیکی تایبەتی تیشکی X دەبێت. ئەگەر لووەکە بەر لە گۆڕانی بۆ شێرپەنجە لاببرێت، شێرپەنجە ڕوونادات.

4. شێرپەنجەی پێست:

بەرکەوتنی زیاد لە پێویستی تیشکی خۆر. ئەگەری تووشبوون بەم شێرپەنجەیە زیاد دەکات. ئەکادیمیای شێرپەنجەی ئەمریکا داوا دەکات ماوە ماوە چێکی پێستیان بکەن بۆ هەر گۆڕانکارییەک لە: ڕەنگ، شێوە، قەبارە کە لەسەر پێست ببینرێت. هەر حاڵەتێکی نائاسایت هەستپێکرد، سەردانی پزیشکی پسپۆڕی پێست بکە.

5. بەرزیی فشاری خوێن:

لەگەڵ تەمەندا ئەگەری تووشبوون بەم حاڵەتە زیاتر دەکات و لە پیاواندا بڵاوترە، بەڵام جەستە و ستایلی نادرووستی ژیان وا دەکەن لە تەمەنێکی زووتردا ئەم حاڵەتە ڕووبدات.

گرنگە هەموو پیاوێک ماوە ماوە فشاری خوێنی خۆی پێوانە بکات. پێوانەی ئاسایی فشاری خوێن 120/80 ملم.جیوەیە.

6. ئاستی کۆلیسترۆلی خوێن:

بەرزیی ئاستی کۆلیسترۆلی خوێن ڕێگایەکە ڕەقبوونی خوێنبەرەکان، جەڵتەی دڵ، جەڵتەی مێشک و چەندین حاڵەتی کوشندەی تر.

بەپێی ستانداردە پزیشکییەکان، ئەو پیاوانەی دەگەنە 20 ساڵی، دەبێ هەموو پێنج ساڵ جارێک ئەنجامی بدەن. دوای تەمەنی 35 ساڵی، باشترە ساڵانە ئەنجامی بدەن.

7. شەکرەی جۆری 2

ئەم نەخۆشییە ئەگەر کۆنترۆڵ نەکرێ، کار لە زۆربەی سیستەمەکانی جەستەی مرۆڤ دەکات.لە تەمەنی 45 ساڵییەوە، هەموو 3 ساڵ جارێک پشکنینێکی شەکرە ئەنجام بدە.

8. ئاوی ڕەشی چاو:

ڕێگا خۆشدەکات بۆ کوێربوون. بەپێی تەمەنەکەت، دەبێ پشکنین بۆ ئەم حاڵەتە ئەنجام بدەیت:

* خوار تەمەنی 40 ساڵ: 2-4 ساڵ جارێک.
* 40-54 ساڵان: 1-3 ساڵ جارێک.
* 55-64 ساڵان: 1-2 ساڵ جارێک
* سەروو 65 ساڵی: 6-12 مانگ جارێک



# پەرستاری لە ئیسلامدا



**م.ی. کەیفی جەمیل قادر**
کۆلێژی پەرستاری/ پەرستاری منداڵان

هەر چۆنێک بێت لە هەموو سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان هەنگاوی دەستپێکردنی پەرستاری دەگەڕیننەوە بۆ (خاتوونی چرا «Lady of lamp» فلۆرینس نایتینگل ) بەڵام سەرچاوە ئیسلامییەکان ڕوانینیان جیاوازە بۆ ئەم بابەتە.

پەرستاری لە ئیسلامدا لە کاتی پێغەمبەرایەتی محمد (صلی الله عیله وسلم) دەست پێدەکات لەسەدەی هەشتەمینی زایینی. ئەمە کاتێک ڕوودەدات کە پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری پەرستاری بەشێکی گرنگی لەشکری موسوڵمانان بوو .

ڕوفەیدەی کچی سەعدی ئەنصاری یان هەندێک جار پێی دەڵێن کوەیبە بە یەکەم پەرستاری لێهاتووی موسڵمانان ناسراوە. ڕوفەیدە لە شاری یپریب لە دایک بووە و لە هۆزی خەزروجە. باوکی ڕوفەیدە پزیشک بووە و ڕوفەیدەی فێری ئەوە کردووە کە چۆن چاودێری نەخۆشەکان بکات لە گەڵی کاری کردووە وەک یاریدەدەرێک.

مێژووەکەی وا پیشان دەدات کە سیفەت و نیشانەکانی پەرستارێکی لێهاتووی تێدا بووە وەک بەخشندەیی، بەسۆزی، توانای بەڕێوەبردن، ڕێکخستن، توانای هەندان و بەخشینی متمانەی هەبوو بۆ کەسانی تر بۆ ئەنجام دانی کاری باش لەگەڵ ئەوانەش کارامەیی پراکتیکی زۆرباش بوو.

ڕوفەیدە تەنها پەرستارێکی پراکتیکی نەبوو بەڵکو مامۆستا بوو. لە قوتابخانەکەی چەند ئافرەتی خۆبەخشی موسڵمانی فێری کاری پەرستاری کردبوو کە چۆن چاودێری نەخۆش و برینداره موسڵمانەکان بکەن.

لەزمانی عەرەبی ووشەی (ئاسیا) بەکارهاتووە بۆ تاکی ئافرەتی پەرستار بۆ کۆی ئافرەتانی پەرستار (ئاوەس) . وەرگێرانی ووشەی (ئاسیا) ئەمانە دەگرێتەخۆی: چاودێری

جەستەی، سۆزی (عاطفی) و رووحی دەگرێتەوە.

مێژوو ناوی ئەو ئافرەتانەی تۆمار کردووە کە لەگەڵ ڕوفەیدە کاریان کردووە: وەک دایکی عمارە، دایکی ئەیمەن، صەفیە، دایکی سولەیم و هیند . چەند ئافرەتێکی تری موسڵمانی بەناوبانگ هەبوون وەک پەرستار لەوانە: نوسەیبەی کچی کەعب، ئامینەی کچی قەیس، دایکی عەتیە، دایکی مەعاویە و دایکی وەریرقەی کچی حاریث.

دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلام لە مەدینە، ڕوفەیدە خۆی تەرخان کرد بۆ چاودێری کردنی نەخۆشە موسڵمانەکان، پێغەمبەر خێمەیەکی لەدەرەوەی مزگەوت پێ بەخشیبوو بۆ چارەسەری موسڵمانە نەخۆشەکان لەکاتی ئاشتیدا.

لەکاتی جەنگیشدا دا ڕوفەیدە بەخۆی و گروپە ڕاهێنراوەکەی دەرۆیشتن بۆ مەیدانی جەنگ و چارەسەری بریندارەکانیان دەکرد.

کاتێک سوپای پێغەمبەر خۆی ئامادە دەکرد بۆ جەنگی خەیبەر، روفەیدە و گروپێکی خۆبەخشی پەرستاران ڕۆیشتن بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عیله وسلم) داوایان لە پێغەمبەر کرد بۆ ڕێپێدانیان، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە دەمانەوێ لەگەڵ تۆ بێینە دەرەوە بۆ جەنگ، ئەویش ڕێگەی پێدان بۆ دەرچوون، ڕوفەیدە و گروپەکەی کارێکی زۆر نایابیان ئەنجامدا، توانیان زۆر ئەرک و فەرمان جێبەجێ بکەن وەک: ئامادەکرنی ئاو بۆ نەخۆش و بریندارن و چاودێری و بەخشینی دەرمان پێیان هەروەها گرینگیدان بە شەهیدان و گواستنەوەیان بۆ شاری مەدینە وەک چاودێری دوای مردن.

وەک ڕێزێک بۆ تێکۆشان و ماندووبونەکەیان پێغەمبەر بەشێک لە غەنیمەتی پێبەخشین کە بەشەکەی وەک بەشی سەربازێک بوو کە بەژداری جەنگی کرد بوو.

لە ناو شەڕەکانی تریشدا خێمە نەخۆشخانەکەی ڕوفەیدە زۆر بەناوبانگ بوو نەک تەنها پێغەمبەر سەرپەرشتی گواستنەوە و هەلگرتنی خێمەی ڕوفەیدەی دەکرد بەلکو سەردانی بریندارەکانیشی دەکرد لەوێ و دەست خۆشی لە ماندووبوونەکەیانی دەکرد.

ڕوفەیدە وەک پەرستاری کۆمەلایەتی: ڕوفەیدە کاری پەرستاری سنوردار نەکردبوو تەنها وەک شوێنێکی کلینیکی بەڵکو دەردەچوو بۆ ناو کۆمەڵگە و چارەسەری ئەو کێشە کۆمەلایەتیانەی دەکرد کە دەبوونە هۆی نەخۆشی، ڕوفەیدە پەرستاری گشتی تەندروستی بوو وە هەم چارەسەری کۆمەلایەتیش بوو. یارمەتی و پاڵپشتیەکەی هەموو موسڵمانێکی گرتبووەوە لەکاتی پێویستی وەک هەتیوەکان، هەژاران و خاوەن پێداویستیە تایبەتیەکان وە زیاتر لەمە دەتوانین بڵێین کە ڕوفەیدە شایەنی ئەمەیە پێی بووترێت دایکی پەرستاری.

یەکەم پەرستار بوو، دامەزرێنەری یەکەم قوتابخانەی پەرستاری و یاسای پەرستار و سەکردەی بواری پەرستاری بوو.



# بڕبڕەکانی پشت و مل: Vertebral column

مهدی بکر: چارەسەری سروشتی

بڕبڕەی پشت لە مرۆڤدا لە کۆڵەکەیەک لە کۆمەڵە ئێسکێکی ناسراو پێک دێت کە پێیان دەوترێت vertebral کە لەهەریەکەیان لەسەری ئەوی دیکەیانەوە یەکەیەک ڕێکدەخات بۆ پێکهێنانی بڕبڕەی پشت،

کە درێژیەکەی لە مرۆڤێکی تەواودا دەگاتە 75سم و لە 33 بڕبڕە پێکدێت، لەنێوان هەر بڕبڕەیەک و یەکێکی تردا کرکراگەیی هەیە کە پێی دەڵێن disc)) و لە هەر لایەکی بڕبڕەیەک لە پشت دوو بەستەر هەیە لە پێشەوە و لە پشتەوە کە یارمەتی بڕبڕەی پشت دەدەن بە گشت لایەکدا بجولێنەوە و تواناش لەسەر چەمانەوە و سورانەوە لەتەواوی ڕوانگەدا هەیە، وە لێکیش نەخشێن، وە لەگەل بەساڵاچووندا ڕەق دەبن و جیری یەکەیان کەمتر دەبێت و هەر لەبەر ئەوەشە زۆر لە پیرەکان چەمانەوەی پشتیان لەلاگرانە.

وە هەروەها بڕبڕەی پشت دەکرێت بە پێنج ناوچەوە کە ئەمانەن:

1 -ناوچەی مل :

لە 7 بڕبڕە پێک دێت یەکەمیان پێی دەلێن ئەتلەس، زۆر بەچەسپاوی بە خوارەوەی کەللە وە نووساوەو کە ڕێگا بەسەر دەدات لە سەرەوە بۆ خوارەوە بجولێت، هەروەکو ئەو کاتەی سەرت بەمانای (بەڵێ) دەلەقێنی.

هەرچی بڕبڕەی دووەمە پێی دەڵێن تەوەرەکە بە نووکێکی درێژ لەسەرەکەیەوە لەگەل ئەتلەسدا جومگاوەو بەهۆی ئەم پێکەوە نووسانەوە ئاوڕدانەوەو سەر سووڕاندن ئاسان دەبێت، هەروەک ئەو کاتەی سەرت بەمانای (نەخێر) دەلەقێنی.

2 -ناوچەی سینگ:

لە12 بڕبڕە پێکهاتووە کە بە پەراسووەکانیان پێوە بەندن، وە مرۆڤ 12 جووت پەراسووی هەیە لە دیوی پشتەوە جومگاون بە بڕبڕەکانی ناوچەی سینگەوە.

3 -ناوچەی کەلەکە:

لە5 بڕبڕەی بانی تەنیشت قوپاوو پێک دێت.




4 - ناوچەی سی بەندە:

ئەویش لە 5 بڕبڕە پێک دێت کە لەگەل یەکدا پێکەوە لکاون و یەک ئێسکیان پێکهێناوە پێی دەڵێن ئێسکی سی بەندە.

5 -ناوچەی کلێنچکە:

لە 4 ئێسکی بەیەکەوە لکاو پێک دێت بوون بە یەک ئێسک وە پێی دەڵێن ئێسکی کلێنچکە.

* وە هەروەها پێویستە سەرنجی ئەوە بدرێ کە دڕکە پەتکیش گەیەنەری سەرەکی نێوان مێشک و بەشەکانی دیکەی جەستەیە، و دڕکە پەتک باش پارێزراوە: بە سێ پەردە دەورە دراوە، کە هەریەکەیان لەوانیتر جیایە، ئەمانەش بە شلەیەک دەورەدراون کە پێی دەگوترێت شلەی دڕکە پەتک، ئەم شلەیە وەک مژەرەی بەرکەوتنەکان کاردەکات. دڕکە پەتک لەناو کەناڵی بڕبڕەکاندا پارێزراوە کەئێسکی وەکو دڕکی بە هێزیان پێوەیە .

وە هەندێ شکانی بڕبڕە زیان بە دڕکە پەتک دەگەیەنێت و دەرئەنجامی زۆر خراپی لێدەکەوێتەوە بۆیە دەبێتە هۆی ئیفلیجی ماسولکە و نەمانی هەست و جوولەی خۆویستی ژێر ناوچە توشبووەکەی لەش، وە زۆر جار نەخۆش کۆنترۆلی نامێنێ لەسەر میز و پیسایی کردن .

* شکانی بڕبڕەی مل :

ئەگەر شکانی بڕبڕەیC3 ،C2 ،C1 ڕوویدات ئەوا دەبێتە هۆی مردنی چونکە بەستراوە بە ناوپەنچک (Diaphragm). بەلام ئەگەر لە C4 تا T1 ئەوا دەبێتە ئیفلیجی چوار پەلەکانی (Quadri pligia):











نیشانەکانی شکانی مل ئەمانەن:

* ملی توش بوو لەوانەیە ئازاری هەبێت
* لەوانەیە نەتوانێت دەست و پێیەکانی بجولێنێت.
* لەوانەیە بەشی ژێرەوەی شکانەکە هەست و جولەی لە ناوچووبێت .

تێبینی \ توش بووەکە مەجولێنن مەگەر ئەوەی کە ناچارین ئەو کارە بکەن، چونکە جولانی هەڵە لەوانەیە ببێتە هۆی ئیفلیجی تەواو (Complete cut).

ڕێگاکانی ڕووبەڕووبونەوەی ئەم جۆرە شکانە:

1 -نەخۆشەکانی کەتوش دەبن لەسەر زەوی تەخت رایان بکێشن.
2 -هێواشی و ئارامی بدەنە نەخۆشەکە.
3 -لە دواوەی سەری نەخۆشەکەو سەری نەخۆشەکەی بۆ بگرن.
4 -بەسود وەرگرتن لە هەر شتێک ببێتە هۆی نەجولانی مل یان لە ملیەوە بپێچنەوەو ملی ڕێک بخەن وەک: تۆقەی مل(colar)
5 -هەناسەدانی کۆنترۆل بکەن.
5 -دەبێت سەری توش بوەکە ڕاست دابنرێت.
6 -ئەو مل پێچەی لە ملیەوە توند مەبەستن.

* شکانی بربرەی پشت:

ئەگەر شکانی بربرە لە T2تا بربرەکانی خوارەوەی پشت ڕوویدات ئەوا دەبێتە هۆی ئیفلیجی پەلەکانی خوارەوە (Paraplegia). ئەمەیان باشترە لە شکانی بڕبرەی مل جونکە توانای جێ بەجێ کردنی کارو پێداویستی ڕۆژانەی هەیە یەگوێرەی ئاستی بەرکەوتنەکەی.

نیشانەکانی ئەم جۆرە شکانە :

* لەوانەیە ئازارێکی بەهێز لە پشتدا هەبێت.
* لەوانەیە توش بوو پێیەکانی نەتوانێت بجولێنێت.
* لەوانەشە هەستەوەرەکانی ژێر ئەو شوێنەی کەشکاوە لەدەست چوو بێت.

تێبینی| توش بووەکە مەجولێنن مەگەر زۆر ناچار بن، بەجولاندنی نابەجێ لەوانەیە ببێتە هۆکاری ئیفلیجی تەواو.

ڕێگاکانی ڕووبەڕووبونەوەی ئەم جۆرە شکانە:

1 -بەتوش بوو بلێن بەهیچ جۆرێک نەجولێت.
2 -لێدانی دڵ و هەناسەی بۆ کۆنترۆل بکرێت.
3 - دانانی پشتێنە بۆ بەستنی پشت تاوەکو نەجولێت .
4 -شتێکی نەرم بخەنە هەردوولای لەشەوە.
5 - شتێکی نەرم بخەنە نێوان هەردوو قاچەکانی.
6 -بیگەیەنە نەخۆشخانە.

# بۆچی دایک و باوک جیاوازی دەکەن لە خۆشەویستیان لە نێو منداڵەکان

ئا: ڕوان عبدالمجید بابان

• بۆچی دایکان و باوکان جیاوازی دەکەن لە خۆشەویستیان لە نێوان من داڵەکان

شتێکی سروشتیە کاتێک باوان جیاوازی دەکەن لە هەستەکانیان بەرامبەر ڕۆڵەکانیان .هەتا ئەگەر واش نەڵێن بە ڕاستی چونکە هەندێ شت هەن ئەم جیاوازیە دەردەخات کە هەستی پێ دەکەن، کاتێ کە دەیانبینی یاری لەگەڵ دەکەن یاخود زیاتر نازیبیان هەڵدەگرن لەچاو خوشک و براکانی تر یاخود بردنە دەرەوەیان لەگەڵ خویان یاخود دابینکردنی پێداویستیەکانیان بەشێوەیەکی بەرچاوتر لەوانی تر بۆیە لیرەدا منیش دەڵێم بۆچی ئەم جیاوازیە لەنێوانیاندا؟

لە لێکۆڵینەوە نوێیەکان دەرکەوتووە کەوا لە 62%ی خێزانەکان تاکێک لە ئەندامەکانیان بەباشتر دادەنێن لەسەرەوەی ئەوانی ترەوە ئەمەش لەبەر هەندێک هۆکار وەکو بوونی پەیوەندیەکی توند و بەهێزتر لەنێوانیان، جا هەیانە منداڵی نۆبەرە و یاخود ئەو منداڵەی کە لە شێوەی خۆی دەچێ لە کاتی منداڵی خۆی یاخود هەندێ هەستی کاریگەری ئەرێنی یاخود نەرێنی لەلا یدروست ببێ لەکاتی لەدایک بوونی، یاخود لەوانیەی منداڵی بچوکی بێ واتە (پاشە بەرە).

ئەو هۆکارانەی کەوا لە خێزانەکان دەکات منداڵێکیان بە باشتر بزانێت لەوانی تر ئەویش جیاوازیکردنیانە لەرووی جەستەی و فکریان، ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی منداڵ هەستبە جیاوازی بکات لە بوونی جیاوازی لە مامەڵەو هەست و سۆزێکی تایبەتر، ئەمەش کاریگەری ئاوێنەییە، سەرەرای ئەمەش ڕیزبەندیان لە ناو خێزان واتە ئەگەر هاتو دایکان و باوکان ڕیزبەندی منداڵەکەیان لە هەمان ڕیزبەندی خۆیان بێت بەو فکرەی کە هەمان هەست و شعوریان هەبێت کە ئەوان هەیانبووە یاخود منداڵی نۆبەرە بێت بەو هەستەی کە خۆی یەکەم کەس بووە هەستی خۆشی بەخشیوەتە خێزانەکەی خۆی

هەروەها تەمەن و باڕودۆخ و رەفتاری منداڵەکە ڕۆڵ دەبینی لەوەی کە خێزانەکەیان جیاوازی بکات بۆ نمونە : ئەو کچەیان پێ باشترە کە هادئ و لەسەرەخۆ و سەرکەوتوە لە قوتابخانە لە چاو ئەو کوڕەی کە هارو هاج و بێعارە، بەلام ئەم بارودۆخەش گۆڕانی بەسەر دێت بە تێپەڕبوونی کات کاتێک کوڕەکە هادئ دەبێتەوە و کچەکەش دەگۆڕێ بۆ هەرزەکارێکی سەرکێش.

وە لە هەموو ڕوانگەیەک و بە ڕەچاوکردنی ئەو شتانەی کە باسمان کرد لە سەرەوە پێویستە لەسەر باوکان و دایکان بە پێی تواناکان خۆیان بەدوور بگرن لەم هەڵسو کەوتە (ئەم جیاوازی کردنە )بۆ ئەوەی نەبنە هۆی دروستبوونی ئیرەیی لە نێوان منداڵەکان و رقلێبونەوەیان لە یەکتری چونکە کار لە بیرو فکریشیان دەکات لە دوارۆژ بۆیە لەسەر باوکان و دایکان پێویستە دادوەری بکەن لە نێوانیان تەنانەت لە دەربڕینی هەستەکانیشیان بۆیان.



# خەمۆکی و دڵ تەنگی



م.ی. مصلح صابر كريم: ماستەر لە پەرستاری دەروونی

لە ڕاستیدا تاڕدەیەک هەست کردن بە دڵ توندی و خەم شتێکی باوە لەلایەن خەڵکی تەندروستەوەش بۆ جی بەجێکردن و بەرەنگاربوونەوەی ئیش وکارەکانی ڕۆژانــە، بـەڵام ئەمەش سنووری خۆی هەیە، بەڵام ئـەگـەر زیاتر لـە سـنووری خۆی تێپەڕاند لەوانەیە بـەرەو پەشێوی خەمۆکی بڕوات.

ئـەوەی من مەبەستمە لێرە باسی بکـەم ئـەویش ئـەوەیـە کـە ئـەگـەر بەراوردێکی سەردەمی ئێستا بکەین لەگەڵ سەردەمی پێشتر بۆ نموونە بیست سـاڵ لـە مـەوبـەر بـۆ مـان دەردەکـەوێت کە سـەردەمـی ئێستا خەڵک زیاتر هەست بە غەم و خەفەت و دڵ توندی دەکات، سـەرەڕای ئەو هـەمـوو تەکنەلۆجیا و پێشکەوتن و خـۆش گـوزەرانـی بە بـەراورد لـەگـەڵ سـەردەمـی پێشتر. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک لەوانە:

1. گرنگی دان بە لایـەنی جەستە وە فـەرامـۆشـکـردنـی لایـەنـی روحی،(دونیاگەرای وماددەپەرستی) چـۆن لـەش پێویستی بە خـۆراک و پۆشاک و گرنگی پێدان هەیە بۆ ئـەوەی بەردەوامبێت وە هەروەها لایەنی روحیش پێویستی بەگرینگی پێدان هەیە باشترین خۆراکیش بۆ لایەنی روحی دینداریە و گوێڕایەڵی خوای گەورەیە وەکو دەفەرمووێت (الا بڋکر الله التكمئن القلوب) وە پێغەمبەری خوا (د.خ) دەفەرمووێت سـەر سوڕمان بۆ کـاری موسلمان لـە کـاتی خۆشـی سوپاسـی خوای گەورە دەکا وە لە کاتێک کە بەلایەکی تـووش دەبـێـت ئــارام دەگـرێـت و سوپاسی خـوای گـەورەدەکـات، لە فـەرمـوودەیـەکـی تـر دەفـەرمـوویـت ئەگەر موسلمانان هەموو گرنگیان بە دوونیا دا شەوق و زەوق و رغبەتیا هـەمـووی بۆ مـاڵـی دونـیـابـوو ئـەوا خوای گـەورە تووشی موسیبەتیان دەکا و تووشی غەمیکیان دەکا کە قەت لەو غەمە ڕزگار نابن، تووشی هەژارییەکیان دەکا کە قەت ناگەن بـەدەوڵـەمـەندیـەکـەی لـەبـەر ئـەوەی هیوای درێژیان هەیە (گول الامل) بەتەمای ژیانێکی زۆرن بەڵام ناگەنە ئەو ژیانە زۆرەش، وە خوای گەورە وایا لیدەکا هەمیشە مەشغول و پڕ ئیش بن، ئەگەر لایەنی روحی وەکو جەستە تێرنەکەی ئەوا دەبێتە هۆی دڵ تەنگی و غەم.

2. زۆربـوونـی گوناهـو تـاوان بە هەموو شێوەکانیەوە ئەمەش دەبێتە هۆی دڵ تەنگی و خەم.

3. ڕازینەبوون (قناعە) بەو بەشەی کـە خــوای گـــەورە بـۆی دیـاری کـــردووی، بـۆ نـمـوونـە زوو زوو گۆڕینی مـۆدیلات وەکـو خـانـوو و ئۆتۆمۆبیل و حـەز کـردن لـە زوو دەوڵەمەندبوون وە شتی تر ئەمەش دەبێتە هۆی دڵ تەنگی و خەم.

4. لاوازبـــــوون و پـچـڕانـدنـی پەیوەندییەکومەڵایەتیەکان، وەکو سەردان و میوانداری ئێستا بەبەراورد لـەگـەڵ پێشان زۆر کـەم بۆتـەوە، ئەمەش هۆیەکەی دەگـەڕێتـەوە بۆ مەشغول بوونی خەڵک بە کاروباری دنیاوە یان جیاوازی بیرو بۆچوونی حزبایەتی.

ئــەوەی لـەسـەرەوە باسـمـان کرد پێشەکیەک بوو لە سەر ژیانی ئەمڕۆ وە لەڕوانگەی زانستی دەروونیوە بـە نەخۆشی دانـانـری بـەڵام دەبـێ سنووورداربکرێت، بەڵام ئەگەر بوو بە پەشێوی خەمۆکی ئەوا بەنەخۆشی دادەنـرێـت هـەروەکـو لـەخـوارەوە ڕوونکراوەتەوە:

**خەمۆکی:**

مرۆڤ لەحالە تی تووشبوونی بە نەخۆشی خەمۆکی هەموو لایەنەکانی ژیانی دەگۆڕێت، ژیان لەژێر سایەی خەمۆکیدا بارێکی گرانە لەهەموو ڕوویـەکـەوە و کـار دەکـاتـە سـەر زۆرینەی لایەنەکانی ژیانی هەر لە کـارکـردن و خـواردن و خـەوتن و چێژوەرگرتنەوە هەتا سێکس کردن و پەیوەندییە کومەڵایەتییەکانی، خـەمـۆکـی تـارمـایـی خـۆی دەخـاتـە سـەر هەموو ئـەم لایەنانەی ژیانی کەسە تووشبووەکە، بۆ نموونە تاکی تووشبوو بە خەمۆکی قورسییەکی زۆر دەبینێت لـە ڕاپـەڕانـدنـی ئیش وکارەکانیدا.

کەواتە خەمۆکی: بریتییە لە گۆڕانی مـیـزاجـی بــەرەو هـەسـت کـردن بە خـەم و دڵ تووندی و نائومێدی و ڕەشبینی وە هەروەها لەدەست دانی حەزو ئارەزووەکانی و چالاکیەکانی ڕۆژانە.

**ڕێژەی تووش بوون:**

ڕێژەی تـووش بـوون لەژناندا دوو هێندەی پیاوانە(لە پیاو 10% و لە ژناندا 25%) وە ڕێژەی خۆکوژتن لە نەخۆشی خـەمـۆکـی (Depression disorder) نزیکەی 15%.

خـەمـۆکـی لـەهـەمـوو تـەمـەنـێکدا ڕوودەدات بـەتـایـبـەتـی لـەنـێوان تەمەنی (20-50) ساڵیدا: منال و بـەسـالاچـووانـیـش لـەم نەخۆشییە بـەدوورنـین، زیـاتـر لـەو کەسانەدا ڕوودەدات کە پەیوەندییەکی لاوازیان بە چواردەورەوە هەیە.

**نیشانەکانی خەمۆکی**

لە خەمۆکی توند و ڕاستەقینە دا ئەو کەسە لەوانەیە هەست بە پێنج یان زیاتر لەم نیشانانەی خوارەوە بکات:
• غەمباری و ڕەشبینی. • هەست کردن بە تاوانباری، بێ نرخی، بێ پشتیوانی، بێ هیوایی، ڕق لە خۆبون و نائارامی. • نەمانی هەوەس و لەزەت بینین لە ئەنجامدانی چالاکیە ئاساییەکان کە پێشتر ئارەزوی کردون (بە ئەنجامدانی سێکسیشەوە). • ئاستەنگ لە تەرکیز کردن و کەم بونەوەی زاکیرە. خراپتر بونی
بێ خەوی یان زۆر خەوتن. • گۆڕانی ئیشتیها بۆ خواردن کە ئەبێتە هۆی زیاد بون یان کەم بونی کێشی لەش. • هەست کردن بە ماندویەتی و کەم وزەیی. • دڵەڕاوکێ، ڕاڕایی و ئاڵۆزی، بیر کردنەوە لە خۆکوشتن مردن. • خاو قسەکردن و خاو جوڵان. • سەرئێشە، ئازاری گەدە و کێشە لە کۆئەندامی هەرس دا

### هۆکار و فاکتەرە مەترسی دارەکانی خەمۆکی:

هۆکارە سەرەکیەکانی خەمۆکی بە تەواوی نەزانراون تا ئێستا، زۆر لە لێکۆڵینەوە پزیشکیەکان ئەنجامەکەی ئەگەڕێننەوە بۆ دروست بونی ناهاوسەنگی کیمیایی لە مێشک دا کە لەوانەیە بۆماوەیی بێت یان بە هۆی ڕودانی کارەساتی ژیانەوە بێت.
، بەڵام لەوانەیە خەمۆکی لە هەندێ کەس دا ڕو بدات کە پەیوەندی نییە بە بۆماوەییەوە و لە خێزانی ئەو کەسەدا حاڵەتی خەمۆکی نەبینراوە. ژیانی پڕ لە چەرمەسەری و پڕ لە سترێس و کارەساتی گەورە لە هەندێ کەس دا ئەبێتە هۆی ڕودانی خەمۆکی، بەڵام لە ڕاستیدا کۆمەڵێ فاکتەر بە یەکەوە کار ئەکەن بۆ ڕودانی خەمۆکی. پیاو و ژن لە هەموو تەمەن، نەتەوە و هەموو ئاستێکی ئابوری توشی خەمۆکی ئەبن هەروەکو چۆن لە منداڵ و مێردمنداڵ و تازەپێگەیشتوانیش دا ڕو ئەدات.

### ژمارەیەک فاکتەر ڕۆڵیان هەیە لە ڕودانی خەمۆکی دا

• ڕاهاتن لەسەر دەرمان و ئەلکهول، ڕوداو و کارەساتەکانی ژیان وەک دابڕان لە خۆشەویست (هاوڕێی کچ یان کوڕ )، کەوتن و دەرنەچون لە پۆلەکانی خوێندنگا، نەخۆش کەوتن یان مردنی ئەندامێکی خێزان، یان جیابونەوەی دایک و باوک (بۆ تازەپێگەیشتوان و مێردمنداڵان). • ڕوداو و کارەساتەکانی ژیانی منداڵی وەک خراپ مامەڵە کردن و پشتگوێ خرانی ئەو کەسە لە تەمەنی منداڵی دا. • تەڵاق، مردنی هاوڕێیەک یان خزمێکی نزیک یان لەدەست دانی کار (بۆ گەورەساڵان). • دابڕانی کۆمەڵایەتی (بڵاوە لە گەورەساڵان دا). • هەندێ حاڵەتی نەخۆشی وەک کەم کارکردنی غودەی دەرەقی (Hypothyroidism )، بەکارهێنانی هەندێ دەرمان وەک لە چارەسەی بەرزەپەستانی خوێن، شێرپەنجە، نەخۆشیە درێژخایەنەکان. • کێشەکانی خەو، بە مانایەکی تر کەسی خەمۆک ڕەشبینە بەرامبەر بە هەموو شتێک و زۆر نێگەتیڤە بەرامبەر بە هەموو ڕوداوێک و ناتوانێت وا تەسەور بکات کە هەر ڕوداوێک، کێشەیەک یان هەڵوێستێک بە شێوەیەکی پۆزەتیڤ حەل ئەبێت..

### دەستنیشان کردنی

بونی پێنج یان زیاتر لە و خاڵانەی کە لەسەرەوە ئاماژەیان پێ دراوە وەک نیشانەکانی خەمۆکی بە لایەنی کەمەوە بۆ ماوەی دوو هەفتە، بەسە بۆ دەستنیشان کردنی. لە هەمان کات دا پێویستە دیاری بکرێت کە هۆکارەکەی یەکێ لەو نەخۆشیە جەستەییانە یان دەرمانانە نین کە ئەو کەسە بەکاریان ئەهێنێت وەک چارەسەر بۆ نەخۆشیەکی تر هەروەک لە سەرەوە ئاماژەی پێ دراوە.

### چارەسەر کردن

ئەو دەرمانانەی کە ئەوکەسە بەکاریان ئەهێنێت بۆ چارەسەری نەخۆشی تر لەوانەیە ئاستی خەمۆکی بەرەو خراپتر ببات و لەوانەیە پێویست بە گۆڕینیان بکات (لەخۆتەوە هیچ دەرمانێک مەوستێنە یان مەیگۆڕە بە بێ ڕاوێژ کردن بە پزیشکەکەت). ئەو کەسانەی کە ئەوەندە خەمۆکن ناتوانن کار و فەرمانەکانیان ئەنجام بدەن، یان ئەو کەسانەی کە بیر لە خۆکوشتن ئەکەنەوە یان مەترسیان بۆ سەر کۆمەڵگا هەیە پێویستە لە نەخۆشخانەکانی چارەسەری دەرونی داخڵ بکرێن بۆ چارەسەر. زوربەی ئەو کەسانەی کە خەمۆکیان هەیە چارەسەر ئەبن و سود وەرئەگرن لە دەرمانەکانی دژی خەمۆکی (Antidepressants) شان بە شانی چارەسەری دەرونی. چارەسەر بەم جۆرە دەرمانانە کاریگەرن و بیرکردنەوە نێگەتیڤەکان کەم ئەکەنەوە، بەڵام کاتیان ئەوێت تا هەست بە باشتر بون بکەن



